ڕووی بەڵگەهێنانەوە:

- بەڵگەی دەق لەسەر ئەوەیە کە باشترین جیهاد بریتییە لەوەی هۆکارێکی بەهێز و ڕاستەوخۆ بێت بۆ شەهیدبوون، بەوەی کە لە ڕیزی یەکەم بێت و ڕوو وەرنەگێڕێت تاکو دەکوژرێت، جا لەمەدا بەڵگەی دەقی تێدایە لەسەر هۆکاری شەهید بوون و فەزڵ و چاکییەکەی.

- وە بە دەلالەتی لێ تێگەیشتن و مەفهوم، ئینغیماس وێنەیەکە لە باشترین وێنەکانی جیهاد، ئەمەش لەبەر ئەوەی وەسفی ڕوو وەرنەگێڕان تا کوژران لەخۆدەگرێت.

- هەروەها بە لەخۆگرتەی وتە؛ ئینغیماس پلەیەکی پێشخراوە بەسەر ڕیزی یەکەم، چونکە ئەو کەسەی کە ئینغیماس دەکات پێش هەموو ڕیزێك دەکەوێت و ڕوو وەرناگێڕێت تاکو دەکوژرێت، فەرموودەکەش بە ڕەهایی باسی کردووە جا بووبێتە هۆکار یان ڕاستەوخۆ بەشدار بێت، کردەوەکەشی نەبەستۆتەوە بە هیچ وەسفێکی تر.

٥. لە معاذ بن عفراء ﵁ ڕیوایەت کراوە «فەرموویەتی: ئەی پەیامبەری الله، ئایا چ شتێك لەلایەن بەندەوە پەروەردگار دێنێتە پێکەنین؟، فەرمووی: «بەبێ هیچ قەڵغان و شتێك دەستی خۆی بخاتە نێو دوژمنەوە»، فەرمووی: ئەو درع و قەڵغانەش فڕێبدات کە لەبەریدا بوو ئینجا شەڕبکات تاکو دەکوژرێت» [ابن أبي شيبة لە المصنف و ابن إسحاق لە السيرة ڕیوایەتیان کردووە].

ڕووی بەڵگەهێنانەوە:

- بەڵگەی دەق لەسەر ئینغیماس کە فەرموویەتی: «دەستی خۆی بخاتە نێو دوژمنەوە» بەبێ ئەوەی باسی هیچ مەرج و شەرتێك بكات بۆی، بەڵکو وەسفی باسکراو (بەبێ هیچ قەڵغان و شتێك) موبالەغەی تێدایە بۆ چوون بەرەو شەهادەت و بوونە هۆکار تیایدا، کە وێنەو شێوازەکە نزیکتر دەکاتەوە لە بەشداری ڕاستەوخۆ و موباشەرە تیایدا.

- هەروەها دەلالەتی ئاماژەی تێدایە لەسەر هۆکاری شەهادەت دەربارەی چوون بەرەو هۆکارەکانی شەهادەت و بەشداربوونی ڕاستەوخۆ تیایدا کە فەرموویەتی: «حاسرا» واتە: بەبێ قەڵغان.

- هەروەها دەلالەتی ئیقرار و پێ ڕازیبوونی تێدایە لەسەر هۆکاری گورز لێدان (النكاية) کە فەرموویەتی: "شەڕ دەکات".

- هەروەها ڕازیبوون و ئیقراری پێغەمبەری تێدایە ﷺ لەسەر کردەوەکەی ابن عفراء، کە قەڵغانەکەی فڕێدا و جەنگا تاکو مردن.

پرسیارەکەش دوای ئەوە ئەمەیە: ئایا وێنەی ئەو کەسە دوورە کە قەڵغانەکەی فڕێ بدات بۆ ئەوەی شەڕبکات و پێداگر بێت لەسەر شەهید بوون و دڵخۆش و شادومان بێت بە پێکەنینی پەروەردگاری بۆی، لەو کەسەی کە پێداگر بێت لەسەر شەهید بوون و جەختی لەسەر بکاتەوە بۆیە هەڵسێت بە بەستنی پشتێنێکی بۆمبڕێژکراو، یاخود ئامێرێکی بۆمبڕێژکراو لێ بخوڕێت موژدەی گەیشتن بە پەروەردگار بەخۆی بدات؟ وەڵامەکەش لەلایەن ئەو کەسانەوە سەرنجی دەدرێت کە خاوەن ئینصاف و دڵسافن.

٦. لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی: «مامم ئەنەسی کوڕی نەضر دواکەوت لە جەنگی بەدر، فەرمووی: "ئەی پێغەمبەری الله، دواکەوتم لە یەکەم جەنگ کە تیایدا دژی موشریکان جەنگایت، ئەگەر الله تعالی بمگەیەنێت بە جەنگی موشریکان ئەوە دەریدەخات کە چی دەکەم، جا کاتێك بوو بە ڕۆژی ئوحود، موسڵمانانیش توشی شکست هاتن، فەرمووی: "ئەی پەروەردگارا من داوای لێبوردن دەکەم لە تۆ لەوەی کە ئەوانە کردیان – واتە هاوەڵەکانی – هەروەها بەرائەت و پاکانەی خۆم دێنمەوە لای تۆ لەوەی کە ئەوانە ئەنجامیان دا – واتە موشریکان - ، ئینجا بەرەو پێش ڕۆیی و سەعد ـی کوڕی معاذ بەرەو پێشی چوو، فەرمووی: "ئەی سەعد ـی کوڕی معاذ، ئەوە بەهەشتە سوێند بێت بە پەروەردگاری نەضر، من بۆنەکەی دەکەم لە ئوحودەوە"، سەعد فەرمووی: "ئەی پێغەمبەری الله ئەوەی کە کردی من نەمتوانی" ئەنەس فەرمووی: "بینیمان هەشتا و شتێك لێدانی بەرکەوتووە بە شمشێر، یان بە ڕم، یان بە تیر لێی دراوە، وە بە کوژراوی دۆزیمانەوە، هەروەها موشریکانیش جەستەیان شێواندبوو، کەس نەیناسیەوە تەنها خوشکەکەی نەبێت بەهۆی پەنجەکانی"، ئەنەس فەرمووی: ئێمە وامان دەبینی یان وا گومانمان دەبرد کە ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو و هاوشێوەکانی دابەزیوە {مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ} تا کۆتایی ئایەتەکە»، ئەمە بە دەربڕینی ئیمام بوخارییە.

**ڕووی بەڵگەهێنانەوە:**

- بەڵگەی دەق لەسەر هۆکاری ئینغیماس، چونکە موسڵمانان شکستیان خوارد و ڕایانکرد و ئەنەسی کوڕی نەضر بەرەو پێش ڕۆیی و ئینغیماسی کردە نێو موشریکان و بیانوو و عوزری بۆ خۆی دەهێنایەوە لەوەی کە هاوەڵەکانی

ئەنجامیان داوە، ئەوەی کە ئەنەسیش لێرەدا کردی هاوڕێکە لەگەڵ وێنەی فەرموودەی یەکەم کە باسمان کرد کە هی ابن مسعود بوو.

- هەروەها دەلالەتی تێدایە لەسەر داواکردنی شەهادەت بە لەخۆگرتەی وتەکان بە فەرموودەکەی: "ئەی سەعد ـی کوڕی معاذ، ئەوە بەهەشتە سوێند بە پەروەردگاری نەضر" جا ئەگەر سوور بێت لەسەر داواکردنی بەهەشت بە سوێندەکەی "سوێند بە پەروەردگاری نەضر" ئەوا لەپێشترە کە داوای شەهادەتی کردبێت.

- هەروەها بەڵگەی دەقی تیایە لەسەر هۆکاری دڵنیابوون لە مردن کە فەرموویەتی: "من بۆنەکەی لە ئوحودەوە دەکەم"، ئەمەش واتا ئەو یەقین و دڵنیایی هەبووە بە شەهادەت و بە بەهەشت.

- هەروەها بە دەلالەتی لێ تێگەیشتن و مەفهوم بوونە هۆکاری مردن و چوون بەرەو مردنی تێدایە بە فەرموودەی ئەنەس: "بینیمان هەشتا و شتێك لێدانی بەرکەوتووە بە شمشێر، یان بە ڕم، یان بە تیر لێی دراوە، وە بە کوژراوی دۆزیمانەوە".

- هەروەها دەلالەتی ئیقرار و پێ ڕازیبوونی پێغەمبەری تێدایە ﷺ بۆ ئەنەسی کوڕی نەضر بە ئینغیماس کردنی بۆ نێو موشریکان و داواکردنی شەهادەت، هەروەها بوونی یەقین و دڵنیایی بە بەهەشت و چوون بەرەو هۆکارەکانی.

- هەروەها دەقی ئەو ئایەتەی تیایە {مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُ} ئەوەیە کە ئەو شتەی نەضر ئەنجامیدا بریتیە لەوەی کە پەیمانی بە الله داوە لەسەری لە خۆڕاگری و فرۆشتنی گیان بە الله، جا ئەمە

بریتیە لە بازرگانییەکە و ئەمە ئەو کڕین و فرۆشتنەیە کە لە ئایەتەکانی پێشوودا باس کرا، بەڕاستی نەضریش ڕاستگۆ بوو لەگەڵ بازرگانی و کڕین و فرۆشتنەکەی بە دەقی ئایەتەکە، بەمەش ئینغیماس کردن و داواکردنی شەهادەتەکەی مەدح کراو و شەرعییە بە دەقی قورئان.

- وە بە لێ تێگەیشتن و مەفهوم ئەوەیە کە سەعد ـی کوڕی معاذ نەیگێڕایەوە و ورەی لێ نەڕووخاند بۆ ئەو مەبەستەی کە هەیبوو، هەروەها گفتوگۆی لەگەڵ نەکرد لەسەر ئەو بەرژەوەندیەی کە لە کردەوەکەیدا دێتە دی یاخود زیان و مەفسەدەی کارەکەی (هەروەك ورە ڕووخێنەکان لەم سەردەمە دەیکەن)، بەڵکو ئەو تێگەیشتنەی لێ وەردەگیرێت کە ئەو لۆمەی نەفسی خۆی کرد لەبەر ئەوەی هاوشێوەی ئەوی نەکرد و نەیکرد بە سەرمەشقی خۆی کاتێك فەرمووی: "ئەی پێغەمبەری الله من نەمتوانی ئەوە بکەم کە ئەو کردی" تەفسیری ئەو ئایەتەش تێپەڕی کە الله تعالی لۆمەی ئەو کەسانەی کرد کە ئاواتی شەهید بوونیان خواست کەچی بەرەو ڕووی نەچوون [بەڵگەی (٣)].

٧. لە ئەنەس ڕیوایەت کراوە ﵁ فەرموویەتی: «پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی دەرچوون تاکو پێش موشریکان کەوتن بەرەو بەدر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «هیچ یەکێکتان نەڕۆن بەرەو هیچ شتێك تاکو من دەڕۆم بەرەو ئەو شتە»، موشریکان نزیك بوونەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «هەڵسن بەرەو بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بە قەد ئاسمانەکان و زەوییە» عومەیری کوڕی حەمام فەرمووی: "ئەی نێردراوی الله، بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بە قەد زەوی و ئاسمانەکانە؟" فەرمووی: «بەڵێ» فەرمووی: "بەخ بەخ"، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «چ شتێك وای

لێکردی بڵێیت بەخ بەخ؟»، فەرمووی: "نا سوێند بە الله هیچ شتێك وای لێ نەکردم ئەی نێردراوی الله تەنها داواو ئومێدی ئەوەم نەبێت کە من لە ئەهلی ئەو بەهەشتە بم" فەرمووی: «تۆ لە ئەهلی ئەو بەهەشتەی» ئەویش هەندێ دەنکە خورمای لە جانتای تیرەکانی هێنایە دەرەوە و دەستی کرد بە خواردنی ئینجا فەرمووی: "ئەگەر من بژیم تاکو ئەو دەنکە خورمایانەم بخۆم ئەوە بەڕاستی ژیانێکی درێژە"، ئینجا هەرچی خورما کە پێی بوو فڕێی دا، پاشان شەڕی لەگەڵ کردن تا ئەوکاتەی کوژرا رضي الله عنه [موسلیم ڕیوایەتی کردووە].

**ڕووی بەڵگەهێنانەوە:**

- دەلالەتی ئاماژەی ناڕاستەوخۆ بۆ داواکردنی شەهادەت کە فەرموویەتی: «هەڵسن بەرەو بەهەشتێك»، بەهەشتیش بە دەست نایەت تەنها بە شەهادەت نەبێت لە خاکی جەنگ.

- وە بە لە خۆگرتەی وتەکان، دەلالەت هەیە لەسەر هۆکاری یەقین بە مردن، واتە: هەڵسن لەکاتێکدا ئێوە یەقینتان هەیە بە بەهەشتێك کە پانتاییەکەی...

- وە بە دەلالەتی ئیقرار و پێ ڕازیبوون بەڵگەی تیایە لەسەر هۆکاری گورز لێدان، کە فەرموویەتی: "ئینجا شەڕی لەگەڵ کردن..."

- هەروەها بە دەلالەتی ئیقرار بەڵگەی تیایە لەسەر هۆکاری ئینغیاس بە شێوازەکانیەوە، چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی بە هاوەڵەکانی کرد کە شەڕ نەکەن تەنها بە ڕیز نەبێت، هەروەها سینگی ئەوانی یەکسان دەکرد بە ڕمەکەی تاکو کەسیان لە ڕیزەکە پێش نەکەون، جا کاتێك عومەیر گوێی لەوە بوو کە بیستی دەربارەی ئەو فەزڵ و چاکەیە لە ڕیزەکە دەرچوو و بە تەنیا هەڵیکوتایە سەر

دوژمن، پێغەمبەریش ﷺ ئینکاری ئەو کارەی نەکرد، سەرەڕای ئەوەی کە مردن سەرەنجامی کارەکەی بوو کە ئەمەش شتێکی بەدیهاتوو بوو.

٨. لە ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئوحود لەگەڵ حەوت پیاوی پشتیوانان و دوو پیاوی قوڕەیش تەنها مایەوە، جا کاتێ لە دەوری کۆبوونەوە ولێی نزیك بوونەوە فەرمووی: «کێ لە ئێمە دووریان دەخاتەوە (بەرپەرچیان دەداتەوە) لە بەرامبەردا بەهەشتی بۆ هەیە، یان ئەو دەبێتە هاوەڵی من لە بەهەشت؟»، پیاوێك لە پشتیوانان بەرەو پێش چوو، شەڕی کرد تاکو کوژرا، ئینجا دووبارە دەوریان لێ دایەوە، فەرمووی: «کێ لە ئێمە دووریان دەخاتەوە(بەرپەرچیان دەداتەوە) لە بەرامبەردا بەهەشتی بۆ هەیە، یان ئەو دەبێتە هاوەڵی من لە بەهەشت؟»، پیاوێك لە پشتیوانان بەرەو پێش چوو، شەڕی کرد تاکو کوژرا، جا هەر بەو شێوەیە بوون تاکو هەر حەوت کەسەکە کوژران، پێغەمبەر ﷺ بە هەردوو هاوەڵەکەی خۆی فەرموو: «بە ئینساف نەبووین لە بەرامبەر هاوەڵانمان» [موسلیم ڕیوایەتی کردووە].

**ڕووی بەڵگەهێنانەوە:**

- دەلالەتی کردەوە لەسەر ئینغیماس، پێغەمبەری الله ﷺ بە تەنها مایەوە لەگەڵ حەوت پیاو لە پشتیوانان و دوو پیاو لە قوڕەیش، واتە لەنێو کۆمەڵێکی کەم بوو لە ڕوو بەڕووبوونەوەی زۆرێك لە کافران.

- هەروەها بەڵگەی دەقی تیایە لەسەر شەرعیبوونی ئینغیماس بە یەقین و دڵنیایی بە مردنەوە، هەروەها گەورەکردنی فەزڵ و چاکەکەی کە فەرمووی: «کێ لە ئێمە دووریان دەخاتەوە (بەرپەرچیان دەداتەوە) لە بەرامبەردا بەهەشتی بۆ هەیە»، جا

لە هاوەڵان دانەیەکیان دەچوو خۆی دەکرد بەناو کافراندا و ئینغیماسی دەکردە ناویانەوە، وە شەڕی دەکرد تاکو دەکوژرا، ئینجا یەکێکی تر ئینغیماسی دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ هانی دەدان سەرەڕای بینینی لەناوچوونی بەدیهاتوو تاکو بەو ڕێگایە حەوت پیاو کوژران.

- لەخۆگرتەی وتەکان بەڵگەی تیایە لەسەر هۆکاری شەهادەت کە فەرموویەتی: «بەهەشتی بۆ هەیە»، واتە هەرکەسێك بەرپەرچیان بداتەوە و لەئێمە دووریان بخاتەوە و بکوژرێت و شەهید ببێت ئەوا بەهەشتی بۆ هەیە.

- هەروەها دەلالەتی ئیقرار و ڕازیبوونی بە کردەوەی هەموویان بە ئینغیماس کردن بە تاك تاك سەرەڕای یەقین و دڵنیابوون لە مردنیان.

- هەروەها دەلالەتی ئیقرار و ڕازیبوونی تیایە لەسەر هۆکاری گورز لێدان (مناط النكاية).

٩. لە سلمة بن الأكوع ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی: «لە سەردەمی حودەیبیە لەگەڵ رسول الله ﷺ چووین بۆ مەدینە، ئینجا من و ڕەباح – غولامی پێغەمبەر ﷺ – دەرچووین بە نیوەڕۆ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، منیش بە ئەسپێکی طلحة ـی کوڕی عبيد الله دەرچووم دەمویست لەگەڵ وشترەکان ئاوی بدەم، جا کاتێك کۆتایی کاتەکانی شەو بوو عبد الرحمن ـی کوڕی عویەینە هێرشی کردە سەر وشترەکانی پێغەمبەر ﷺ، شوانەکەیانی کوشت و دەستی کرد بە ڕاوەدونانیان، خۆی و خەڵکانێك لەگەڵی بە ئەسپەوە، گوتم: ئەی ڕەباح، لەسەر ئەم ئەسپە دابنیشە و بیگەیەنەوە بە تەڵحە، هەروەها هەواڵیش بدە بە پێغەمبەر ﷺ کە

هێرش کراوەتە سەر ئاژەڵەکانی، فەرمووی: هەڵسامە سەر پێ لەسەر گردێك و ڕووی خۆم وەرگێڕا بەرەو ڕووی مەدینە ئینجا سێ جار هاوارم کرد "وا بەیانییە"، فەرمووی: "ئینجا شوێن قەومەکە کەوتم کە شمشێرەکەم و تیرەکانم پێ بوو، دەستم کرد بە پێکانیان و بریندارکردنیان"... تا ئەو جێگەیەی کە فەرمووی: "جا بارودۆخی من و ئەوان هەر بەو شێوەیە بوو شوێنیان دەکەوتم و قسەمان بە یەکتر دەوت، تاکو هەر شتێك کە الله تعالى دروستی کردبێت لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوە خستمەوە پشت خۆم، وە دەرم هێنا لە دەستیان، ئینجا منیش هەر بە ئامانجم دەگرتن تا ئەوکاتەی سی ڕمیان فڕێدا، هەروەها زیاتر لە سی کراس، چونکە لێی دەترسان، هیچ شتێکیش لەمەیان فڕێ نەدەدا مەگەر ئەوەتا من بەردێکم دادەنایە سەری، وە کۆم کردەوە لەسەر ڕێگەی پێغەمبەر ﷺ، هەتاکو چێشتەنگاو توند بوو عویەینەی کوڕی بەدری فەززاری هات بۆ لایان بۆ پشتیوانی کردنیان لە ڕێگایەکی لایەکی چیاکە، ئینجا بەسەر چیاکە سەرکەوتم من لە سەرروویانەوە بووم، عویەینە گوتی: ئەمە چیە؟ من چی دەبینم؟ وتیان: لەم تەسکاییەدا گەیشتین پێی، وازی لێ نەهێناوین لە بەرە بەیانەوە تا ئێستا، وە هەموو شتێك کە لە دەستمان بوو بردی و خستیە پشت خۆیەوە" عویەینە وتی: "ئەگەر ئەو کەسە وای نەبینێت کە لەدوای خۆی داوایەك هەیە ئەوا وازی لێ دەهێنان، با یەکێك لە ئێوە بۆی هەڵسێت" چوار کەس بۆم هەستان، بەسەر چیاکەدا سەرکەوتن، جا کاتێك گوێم لە دەنگیان بوو وتم: "دەمناسن؟" گوتیان: "جا تۆ کێی؟" گوتم: "من ابن الأكوع ــم، سوێند بەو زاتەی کە ڕووی محمد ــی شکۆمەند کردووە یەکێك نیە لە ئێوە کە بەدوامەوە بێت و پێم بگات، وە کەسێك نیە لەناوتان کە من بەدوایەوە بم کەچی لە دەستم دەربچێت" پیاوێك لەوان وتی: "من گومان دەبەم" فەرمووی: "لە

شوێنی دانیشتنەکەم لانەچووم تاکو بینیم سوارچاکەکانی پێغەمبەر ﷺ تێکەڵاو بە دارەکان بوون، یەکەمیان الأخرم الأسدي بوو، لە شوێن ئەویشدا أبو قتادة سوارچاکی پێغەمبەر ﷺ بوو، منیش لە چیاکە هاتمە خوارەوە و چوومە لای الأخرم، پەتی ئەسپەکەیم گرت و گوتم: "ئەی أخرم ئاگاداری قەومەکە بکەوە – هۆشداریان پێ بدە – چونکە من سەلامەتی ئەوەت پێ نادەم کە لە دەستت دەرباز ببن، جا لەسەر خۆ بە تاکو پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی دەگەن پێت" فەرمووی: "ئەی سەلەمە ئەگەر تۆ باوەڕت بە الله و بە ڕۆژی دوایی هەیە و دەزانی کە بەهەشت حەقە و دۆزەخیش حەقە، ئەوا نەیەیتە نێوان من و شەهادەت"، فەرمووی: "منیش پەتی ئەسپەکەیم بەردا" ئەویش دەگات بە عبد الرحمن بن عيينة، عبد الرحمن ـیش سۆزدار دەبێت بەرامبەری و دوو خەنجەر لە یەکتر دەدەن، الأخرم عبد الرحمن بریندار دەکات و عبد الرحمن ـیش بە خەنجەرێك لێی دەدات و دەیکوژێت، ئینجا عبد الرحمن دەگات بە ئەسپەکەی الأخرم و أبو قتادة ـش پێی دەگات ئەوانیش دوو خەنجەر لە یەکتر دەدەن، أبو قتادة بریندار دەبێت و ئینجا أبو قتادەش دەیکوژێت، ئینجا أبو قتادة دەگات بە ئەسپەکەی الأخرم، تا ئەو جێگەیەی کە فەرمووی چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتم: "ئەی پێغەمبەری الله لێمگەڕێ سەد لە هاوەڵەکانت هەڵبژێرم و لەکاتی ڕەشایی شەودا بدەم بەسەر کافراندا، هیچ هەواڵدەرێك نامێنێتەوە لەناویان مەگەر ئەوەتا کوشتوومە" فەرمووی: "ئایا ئەوە دەکەیت ئەی سەلەمە؟" گوتی: گوتم: "بەڵێ سوێند بەو زاتەی کە شکۆمەندی کردوویت"، پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی تاکو ددانەکانیم بینی لەبەر ڕۆشنایی ئاگرەکە، تا ئەو جێگەیەی فەرمووی: "کاتێك

بەیانیان کردەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «چاکترینی سوارچاکەکانمان ئەمڕۆ أبو قتادة بوو، وە چاکترین پیادەشمان سەلەمەیە» جا پێغەمبەر ﷺ بەشی سوارچاك و پیادەی پێدام» [موسلیم ڕیوایەتی کردووە].

**ڕووی بەڵگەهێنانەوە:**

- دەلالەتی ئاماژەدان بە شەرعیبوونی ئینغیماس بە هەموو شێوازەکانی، ئەمەش بە ستایش و مەدحی پێغەمبەر ﷺ، هەروەها ئیقرار و ڕازیبوونی بە کردەوەی سەلەمە کە شوێن کۆمەڵێکی زۆر کەوتبوو، کە یارمەتیشی بۆ هات لەلایەن کافرانەوە، هەروەها کردەوەی الأخرم الأسدي کە بە تەنیا ئینغیماسی کرد نێویانەوە یەقینی بە شەهادەت هەبوو، وە پێی گەیشت بە فەزڵ و بەخششی الله، هەروەها کردەوەی أبي قتادة کە ئینغیماسی کردە نێویانەوە سەرەڕای زاڵبوونی گومان بە مردن ئینجا گورزی لێدان و زیانی پێگەیاندن، ڕزگاریشی بوو بە فەزڵ و بەخششی الله.

- دەلالەتی ئاماژە و ئیقراری تیایە لەسەر هۆکاری گورز لێدان بە کردەوەی سەلەمە کە بەئامانجی دەگرتن و بریندارى دەکردن، هەروەها وتەکەیان: "لەم تەسکاییە توشی ئەمە بووین و وازی لێ نەهێناوین لەوەتەی بەرە بەیان، هەموو شتێکیشی لە دەستمان دەرهێنا و خستیە پشت خۆیەوە".

- هەروەها دەلالەتی ئاماژە و ئیقراری تیایە لەسەر هۆکاری یەقین بە مردن، بە وتەی الأخرم بۆ سەلەمە: "ئەی سەلەمە ئەگەر تۆ باوەڕت بە الله و بە ڕۆژی دوایی هەیە و دەزانی کە بەهەشت حەقە و دۆزەخیش حەقە، ئەوا نەیەیتە نێوان من و شەهادەت".

- هەروەها دەلالەتی ئاماژە و ئیقراری تیایە لەسەر هۆکاری داواکردنی شەهادەت، بە وتەی الأخرم بۆ سەلەمە: "نەیەیتە نێوان من و شەهادەت".

- هەروەها ئەوەی تیایە کە ئینغیماس شەرعییە بۆ پێویستی ئەگەر هاتوو زەروورەتیش نەبێت، جا بەرژەوەندیەکە بەدەست هات بە ڕزگاکردنی وشترەکانی پێغەمبەر ﷺ، قەومەکەش ڕایان کرد سەرەڕای ئەوەش سەلەمە و الأخرم و أبو قەتادە ئینغیماسیان کرد، پێغەمبەریش ﷺ ئیقراری کرد لەسەر ئەمە و پێی ڕازی بوو.

- هەروەها دەلالەتی ئیقراریش بە دەست هاتووە بە بێدەنگ بوونی پێغەمبەر ﷺ.

- هەروەها دەلالەتی ئاماژە بەدەست هاتووە بە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: «چاکترینی سوارچاکەکانمان ئەمڕۆ أبو قتادة بوو، وە چاکترین پیادەشمان سلمة یە»، هەروەها بە پێکەنینی بۆ سەلەمە تا ئەوکاتەی ددانەکانی دەرکەوتن، دایك و باوکم بە فیدای بن.

١٠. لە ئەبی هورەیرە ﵁ ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی: «پێغەمبەر ﷺ چەند پیاوێك(کەمتر لە دە پیاو)ـی لە سریەیەك نارد بۆ چاودێری، عاصم ـی کوڕی ثابت الأنصاري کرد بە ئەمیر بەسەریانەوە کە باپیری عاصم ـی کوڕی عومەرە، جا دەرچوون تاکو گەیشتنە (الهدأة) کە نێوان عسفان و مەککەیە، باسیان کرا لای کەسانی ناوچەیەك لە هذیل کە پێیان دەوترا بەنو لحیان، جا نزیکەی دوو سەد پیاو دەرچوون بۆیان، هەموویان تیرهاوێژ بوون، دوای شوێن پێیەکانیان کەوتن تاکو بینیان کە خواردنیان خورمایە لە مەدینەوە کۆیان کردۆتەوە، وتیان

ئەمە خورمای یەثربە، بۆیە بەدوای شوێن پێیەکانیان بکەون، جا کاتێك عاصم و هاوەڵانی ئەوانیان بینی پەنایان بردە بەر گردێکی(تا ڕادەیەك بەرز) و خەڵکەکەش دەوریان لێدان، پێیان وتن دابەزن و دەستەکانتان بدەن بە ئێمە، ئێمەش پەیمان و بەڵێنتان پێ دەدەین، کەسیشتان لێ ناکوژین، عاصم ـی کوڕی ثابت ئەمیری سریەکە فەرمووی: "سەبارەت بە من، سوێند بە الله ئەمڕۆ دانابەزم بۆ ژێر سایەو پارێزراوی کافرێك، ئەی پەروەردگارا هەواڵ بگەیەنە پێغەمبەرەکەت دەربارەی ئێمە"، ئەوانیش بە تیر بەئامانجیان گرتن، لە ئاکامدا عاصم و حەوت کەسی تریشیان لێ کوشتن، سێ پیاویش بۆیان دابەزین بۆ پەیمان و بەڵێن، لەوانەش خوبەیبی ئەنصاری، هەروەها ابن دثنة و پیاوێکی تر، جا کاتێك توانایان شکا بەسەریاندا(زاڵبوون بەسەریان) پەتەکانی قیسیەکانی خۆیان دەرکرد(کە کەتانێکی توندە) و بەو پەتانە ئەوانیان بەستایەوە، پیاوی سێیەم فەرمووی: "ئەمە سەرەتای غەدر و خیانەتە سوێند بە الله هاوەڵێتیتان ناکەم، بەڕاستی نمونە و سەرمەشق هەیە لەوانە، کە مەبەست پێی کوژراوەکان بوو"، ئەوانیش ڕایان کێشا و هەوڵیان لەگەڵی دا بۆ ئەوەی هاوەڵییان بکات بەڵام ڕەتی کردەوە، بۆیە کوشتیان، ئەوکات خوبەیب و ابن دثنة ـیان برد لەگەڵ خۆیان و لە مەککە هەردووکیانیان فرۆشت» [بوخاری ڕیوایەتی کردووە].

**ڕووی بەڵگەهێنانەوە:**

- بەڵگەی ئیقرار و پێ ڕازیبوون لەسەر هۆکاری شەهادەت، چونکە ئەمیری سریەکە کە عاصم ـی کوڕی ثابت بوو بڕیاریدا کە دانەبەزێتە ژێر سایەو پاراستنی کافر، وە یەقین و دڵنیایی هەبوو بە شەهادەت کە فەرمووی: «ئەی پەروەردگارا هەواڵمان بگەیەنە بە پێغەمبەرەکەت»، پاشان پیاوی سێیەم سەرمەشقی

له حەوت پیاوەکەی تر وەرگرت و ڕەتیکردەوە هاوەڵێتی کافران بکات، سەرەڕای ئەوەی کەوتە دەستیان و هەوڵیان لەگەڵیدا تاکو کوژرا، جا پێغەمبەر ﷺ ئیقراری کرد لەسەر ئەوەی کە عاصم کردی و ئەوەش کە وەك ئەوی کرد وە نکوڵی کردەوەکەی لێ نەکردن سەرەڕای بوونی یەقین و دڵنیاییش لە مردنیان، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو پیاوەی ململانێی لەگەڵ کافران کرد دوای دەستگیرکرانی هیچ گورز و زیانێکی لێ نەدان، وە هیچ بەرژەوەندیەکی ئاشکرای بەدی نەهێنا.

- هەروەها ئاماژەی تێدایە لەسەر ئینغیماس کردن بە کۆمەڵێك کە ژمارەیان کەم بێت (کەمتر لە دە کەس) بەرامبەر دوژمنێکی زۆر (دوو سەد پیاو).

١١. له ئەبی بەکری کوڕی عبد الله ـی کوڕی قەیس لە باوکیەوە ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی: «گوێم لە باوکم بوو لەکاتێکدا لە بەرامبەر دوژمن ئامادە بوو دەیفەرموو: پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی دەرگاکانی بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکانن»، پیاوێك کە شێوازی جەستەی زۆر ڕێك و پێك نەبوو هەڵسایەوە فەرمووی: "ئەی ئەبا موسا ئایا تۆ لە نێردراوی الله ﷺ بیستووتە کە ئەمە دەڵێت؟" فەرمووی: "بەڵێ" فەرمووی: گەڕایەوە لای هاوەڵەکانی فەرمووی: سەلامتان بەسەردا دەخوێنمەوە (سەلامتان لێ دەکەم)، ئینجا کێلانی شمشێرەکەی شکاند و فڕێی دا ئینجا بە شمشێرەکەیەوە بەرەو ڕووی دوژمن ڕۆیشت، جا دەستی کرد بە لێدانیان تاکو کوژرا» [موسلیم ڕیوایەتی کردووە].

**ڕووی بەڵگەهێنانەوە:**

- دەلالەتی ئاماژەی ناڕاستەوخۆی تێدایە لەسەر هۆکاری شەهادەت کە فەرموویەتی ﷺ: «بەڕاستی دەرگاکانی بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکانن».

هەروەها ئیقراری کردەوەی هاوەڵەکەی تێدایە بۆ کردەوەی ئەو پیاوەی کە ئینغیماسی کردە نێو دوژمن دوای بیستنی فەرموودەکە و هەبوونی یەقین و دڵنیایی بە مردن بە شکاندنی کێلانی شمشێرەکەی، هەروەها ماڵئاوایی کردنی لە هاوەڵەکانی.

١٢. ابن جرير لە تاریخەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە جەنگی موئتە، فەرموویەتی: «ئینجا جەعفەری کوڕی ئەبی طالب ئاڵاکەی وەرگرت و پێیەوە جەنگا، تا کاتێك شەڕ و کوشتار دەوری لێدا خۆی کرد بەناویاندا بە ئەسپێکی مەیلەو زەرد، ئینجا بریندارى کرد و شەڕی لەگەڵ قەومەکە کرد تاکو کوژرا، جا جەعفەر یەکەم پیاو بوو لە موسڵمانان کە لەپێناو ئیسلامدا ئەسپەکەی بریندار ببێت (شەڕی پێ نەکرێت» [طەبەری لە تاریخەکەی و ابن إسحاق لە سیرەکەیدا ڕیوایەتیان کردووە].

**ڕووی بەڵگەهێنانەوە:**

- دەلالەتی ئیقرار و ڕازیبوونی تێدایە لەسەر هۆکاری داواکردنی شەهادەت و هۆکاری یەقین بە مردن، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە کردەوەکەی جەعفەری زانی کە ئەسپەکەی بریندار کرد، ئەویش ئیقراری کرد لەسەر ئەمە و پێی ڕازی بوو.

١٣. هەروەها بەیهەقی لە السنن الکبری بە ئیسنادێکی صەحیح ڕیوایەتی کردووە لە موجاهید، فەرموویەتی: «پەیامبەری الله ﷺ عبد الله ـی کوڕ مەسعود و خەببابی لە سریەیەك نارد، هەروەها دوحیەی بە تەنها لە یەك سریە نارد».

١٤. هەروەها أبو يعلى لە موسنەدەکەی ڕیوایەتی کردووە لە عبد الله ـی کوڕی ئەنیس فەرموویەتی: «ئینجا پێغەمبەر ﷺ بە تەنها ناردی لە یەك سریە».

١٥. الطبراني له المعجم الكبير ڕیوایەتی کردووە لە حوذەیفە فەرموویەتی: «ئینجا پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئەحزاب بە تەنیا لە یەك سریەدا ناردی».

**ڕووی بەڵگەهێنانەوە:**

- لەم سێ فەرموودەیەدا کردەوەی پێغەمبەر ﷺ بە ناردنی پیاوێك بە تەنها لە سریەیەکدا، کە ئەگەری ئینغیماس و شەهادەتی تیایە.

١٦. لە ئەبی موسای ئەشعەری ﷺ ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی: «پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی پیاوێك بۆ ئازایەتی شەڕ دەکات وە یەکێکیش کە بۆ دەمارگیری شەڕ دەکات، وە یەکێکیش کە بۆ ڕیاو ڕووپامایی شەڕ دەکات، ئایا کام لەمانە لەپێناو الله ـیە؟، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هەرکەسێك بجەنگێت بۆ ئەوەی دین و وشەی الله بەرز بێتەوە ئەوە لەپێناو الله ـیە» [متفق علیه].

**ڕووی بەڵگەهێنانەوە:**

- بەڵگەی دەقی تیایە لەسەر هۆکاری نییەت لەپێناو الله.

# بەشی سێیەم

## بەڵگەکان لە وتە و کردەوەکانی هاوەڵان

دوانزە ئەثەری تیایە، پێنج دانە لەناویاندا بە وتەیە و حەوت دانەش بە کردەوە، بەڵگە و دەلالەت دەدەن لەسەر تێگەیشتنی هاوەڵە شکۆمەندەکان لە مەسەلەی ئینغیماس و ئەنجامدانی کردەوەکە بە خودی خۆیان.

١. لە ئەسلەمی کوڕی عمران ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی: «ئێمە لە شاری ڕۆم بووین، ئەوانیش ڕیزێکی گەورەیان بۆ ئێمە هێنایە دەر لە ڕۆمەکان، موسڵمانانیش هاوشێوەی ئەوان بۆیان دەرچوون، لەسەر خەڵکی میسڕ عوقبەی کوڕی عامر(فەرماندە بوو) وە لەسەر کۆمەڵی موسڵمانانیش فضالەی کوڕی عبید بوو، پیاوێك لە موسڵمانان خۆی کرد بەناو ڕیزەکانی ڕۆم تاکو چووە ناویانەوە، خەڵکەکەش هاواریان کرد و گوتیان: "پاك و بێگەردی بۆ الله(سبحان الله) خۆی لەناوبرد بە دەستی خۆی"، أبو أیوب الأنصاري رضي الله عنه لەناویاندا هەڵسا و فەرمووی: "ئەی خەڵکینە: ئێوە ئەم تەئویل و لێکدانەوەیە دەکەن، لەکاتێکدا ئەم ئایەتە لەسەر ئێمە دابەزیوە کە کۆمەڵی پشتیوانانین، کاتێك الله تعالى ئیسلامی سەربڵند کرد و سەرخەرانی زۆر بوون، هەندێکمان بە نهێنی بە هەندێکی ترمان وت بێ ئەوەی پێغەمبەری الله ﷺ ئاگادار بێت: "بەڕاستی موڵك و سامانەکانمان لەناوچوو، الله تعالى ـش ئیسلامی سەربڵند کرد و سەرخەرانی زۆر بوون، جا چی دەبێت گەر بچینەوە نێو ماڵ و سامانەکەمان و ئەو بەشەی لێ چاك بکەینەوە کە لە دەستمان چووە، الله تعالى ـش پەیامی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی و وەڵامی ئەوەی داینەوە کە وتمان -فەرمووی-: {وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا

بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ}، لەناوچوونەکەش بریتی بوو لە جێگیر بوون لەسەر ماڵ و سامان و چاک کردنی هەروەها وازهێنانمان لە جیهاد، جا أبو أيوب هەر بەو شێوەیە لە جەنگ و جیهاد بوو تاکو لە خاکی ڕۆم لە گۆڕ نرا "ژێرخاك کرا"».

هەروەها البيهقي لە السنن فەرموویەتی: «باب جواز انفراد الرجل والرجال بالغزو في بلاد العدو» واتە: جائیز بوونی تەنها بوونی پیاو یان چەند پیاوێك بۆ جەنگ و جیهاد لە خاکی دوژمن.

٢. ابن المبارك و ابن أبي شيبة بە سەنەدی صەحیح ڕیوایەتیان کردووە «لە مدرك بن عوف الأحمسي فەرموویەتی: "لەلای عومەر بووم ﵁، لەوکاتەدا نێردراوی النعمان بن مقرن هات بۆ لای، عومەریش پرسیاری لێکرد دەربارەی خەڵك، فەرمووی: "فڵان و فڵان بریندار بوون و کەسانێکی تریش کە من نایانناسم" عومەر ﵁ فەرمووی: "بەڵام الله دەیانناسێت" فەرمووی: "ئەی ئەمیری ئیمانداران! پیاوێکیش نەفسی خۆی فرۆشت" مدرك بن عوف فەرمووی: "ئەویان خاڵم بوو سوێند بە الله ئەی ئەمیری ئیمانداران، خەڵکی لافی ئەوەیان لێدەدا کە خۆی لەناوبردووە بە دەستی خۆی" عومەر فەرمووی: "درۆیان کرد ئەوان، بەڵکو ئەو لەو کەسانەیە کە ئاخیرەتی بە دونیا کڕیوە"» البيهقي باسی کردووە کە ئەمە لە ڕۆژی نەهاوەند بووە.

٣. ابن أبي شيبة لە المصنف ڕیوایەتی کردووە «لە ابن عون ئەویش لە محمد فەرموویەتی: کەتیبەیەك لەلای ڕۆژهەڵاتەوە هات، لە کەتیبەکانی کافران، پیاوێکیش لە پشتیوانان(الأنصار) ڕوو بە ڕوویان بوویەوە، بەرەو ڕوویان ڕۆیشت، ڕیزەکەی شکاند تاکو دەرچوو، ئینجا گەڕایەوە، ئینجا هەمان شتی ئەنجامدا دوو

جار یان سێ جار، جا سعد بن هشام ئەمەی باس کرد بۆ أبي هريرة، ئەویش ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ}.

٤. هەروەها الحاكم لە کتابی التفسير دەریهێناوە، هەروەها ابن أبي حاتم (لە أبي إسحاق ئەویش لە بەڕاء ﵁ کە پیاوێك پێی وت: "ئەی أبا عمارة، گوتەی الله تعالى {وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ}، ئایا ئەو پیاوەیە کە ڕوو بەڕووی دوژمن دەبێتەوە و شەڕ دەکات تاکو دەکوژرێت؟"، فەرمووی: "نەخێر، بەڵکو ئەو پیاوەیە کە تاوانێك ئەنجام دەدات ئینجا دەڵێت: الله تعالى لێم خۆشنابێت"» الحاكم فەرموویەتی: صەحیحە لەسەر مەرجی هەردووکیان (بوخاری و موسلیم).

٥. هەروەها لە ڕیوایەتێکی ابن عساكر و غەیری ئەویش لەم فەرموودەیە: «أبو إسحاق فەرموویەتی گوێم لە بەڕاء بوو، کە پیاوێك پرسیاری لێکرد دەربارەی ئەم ئایەتە {وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ}، ئایا ئەو پیاوەیە کە هێرش دەکاتە سەر کەتیبەیەك لەکاتێکدا ئەوان هەزار کەسن و پیاوەکەش شمشێری لەدەستە؟، فەرمووی: نەخێر، بەڵکو ئەوە لەبارەی پیاوێکە کە تاوانێك ئەنجام دەدات ئینجا خۆی لەناوببات بە دەستی خۆی بڵێت: تەوبە بۆ من نیە».

٦. البيهقي لە السنن الكبرى- كتاب السير و غەیری ئەویش ڕیوایەتی کردووە، فەرموویەتی: « وە لە ڕۆژی یەمامە کاتێ بەنو حەنیفە لەناو باخچەی موسەیلەمە خۆیان قایم و قەڵابەند کرد کە بە باخچەی ڕەحمان یان مردن دەناسرا، بەڕائی کوڕی مالیك بە هاوەڵەکانی فەرموو: "بمخەنە نێو الجفنة ـیەك – کە قەڵغانێکە لە پێست بەردی لەنێو دادەنرا و بەرەو ڕووی دوژمن دەهاوێژرا – وە بمهاوێژن"، ئەوانیش بە تەنیا هاوێشتیان و دەستی کرد بە شەڕکردن لەگەڵیان و دە کەسی لێ

کوشتن و دەرگاکەشی کردەوە، لەو ڕۆژەشدا بریندار بوو بە هەشتاو چەند برینێك، تاکو دەرگای بۆ موسڵمانان کردەوە، هیچ یەکێکیش لە هاوەڵان ئینکاری ئەو شتەی لێ نەکرد الله تعالی لە هەموویان ڕازی بێت».

لە ئیقراری هاوەڵان و ڕازی بوونیان بەو کارە بەڵگە هەیە لەسەر جائیز بوونی هەموو کردەوەیەکی جیهادیی تەنانەت ئەگەر لەناوچوون تیایدا ڕاستەقینە و بەدی هاتوو بێت.

٧. هەروەها ابن عساکر لە تاریخی دیمەشق بە ئیسنادی خۆی هێناویەتیەوە: « لە عوقبەی کوڕی قەیسی کیلابی: کە پیاوێك بە أبو عبیدة ـی کوڕی جەڕاحی فەرموو ﵁ لە ڕۆژی یەرموك: "من کاروباری خۆم کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی بدەم بەسەریاندا، جا ئایا هیچ وەسیەتێکم دەکەن بۆ لای پێغەمبەرەکەتان ﷺ، فەرمووی: سەلامی لێ بکە، وە هەواڵیشی پێ بدە کە ئێمە ئەوەمان بینی کە پەروەردگارمان بە حەق بەڵێنی پێبدابووین».

٨. هەروەها ابن المبارك ڕیوایەتی کردووە لە ثابت: کە عیکریمەی کوڕی ئەبی جەهل ﵁ لە فڵان ڕۆژدا پیادە بوو، خالیدی کوڕی وەلید پێی فەرموو: "وانەکەیت چونکە کوژرانت سەخت دەبێت بەسەر موسڵمانانەوە" فەرمووی: "لێمگەڕێ خالید، چونکە تۆ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پێشینەت هەبووە، من و باوکیشم توندترین کەس بووین دژ بە پێغەمبەر ﷺ، جا ڕۆیشت تاکو کوژرا».

٩. هەروەها ابن جریر الطبري لە تاریخەکەیدا ڕیوایەتی کردووە: «کە عبد الله ـی کوڕی زوبەیر لە ڕۆژی الجمل ململانێ(موصارەعە)ـی کرد لەگەڵ الأشتر

النخعي، دوو خەنجەریان لە یەکتر دا، جا کاتێك عبد الله بینی کە الأشتر خەریکە دەربازی دەبێت لە دەستی، وتە بەناوبانگەکەی خۆی وت: (من و مالیك بکوژن)، الشعبي فەرموویەتی: "خەڵکی الأشتریان نەدەناسی بەناوی مالیك، خۆ ئەگەر ابن الزبیر گوتبای: "من و ئەشتەر بکوژن"، ئەوا گەر الأشتر هەزار گیانی هەبوایە ئەوە هیچ یەکێك لەوان دەرباز نەدەبوو، ئینجا هەر خۆی ڕادەچڵەکاند لە دەستی ابن الزبیر تاکو لە دەستی دەربازی بوو"».

١٠. ابن عساکر لە تاریخی دیمەشق بە ئیسنادێکی چاك ڕیوایەتی کردووە: «لە عبد الرحمن ـی کوڕی ئەسوەد عبد یغوث کە ئەوان دیمەشقیان گەمارۆدا، پیاوێکیش لە أسد شنوءة دەرچوو، بە تەنها ڕۆیشت بە خێرایی بەرەو ڕووی دوژمن بۆ ئەوەی بکوژرێت، موسڵمانانیش بەم شتە عەیبداریان کرد، باسەکەشی بەرز کرایەوە بۆ لای عمرو بن العاص ﵁ کە ئەویش لە سەرکردایەتی سەربازانێك بوو لە سەربازەکان، عمرو لەدوای نارد ئەویش وەڵامی دایەوە، عمرو پێی فەرموو: {إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ}، وە فەرمووی: {وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ}، پیاوەکەش پێی فەرموو: "ئەی عمرو بە الله بیرت دێنمەوە کە تۆی لە سەرانی کوفر بینی ئینجا تۆی کرد بە سەرێك لە سەرانی ئیسلام، ڕێگریم لێ نەکەیت لە شتێك کە لە دەروونی خۆم دامناوە، چونکە من دەمەوێت بڕۆم تاکو ئەمە لادەچێت، ئاماژەی دا بە چیایەکی بەفرین، جا هەر بەردەوام بوو لە داواکردن لە عەمرو تاکو ڕێگەی پێدا، ئەویش دەرچوو تاکو ئێوارەی کردەوە و گەیشت بە بەشێکی شەو پێش دوژمن، ئینجا گەڕایەوە، موسڵمانان فەرموویان: "سوپاس بۆ الله کە تۆی گەڕاندەوە و ئەوەی نیشاندایت کە غەیری ڕاو بۆچوونی تۆ بوو"، فەرمووی: "بەڕاستی من پاشەکشەم

نەکردووە لەوەی کە لە دەروونم هەیە سوێند بە الله، بەڵام من ئێوارەم بینی و ترسام کە لەو خاکە چۆڵەدا لەناو بچم"، جا کاتێك بەیانی هات ڕۆیشت بەرەو ڕووی دوژمن، وە جەنگا تاکو کوژرا ڕەحمەتی پەروەردگاری لێبێت» ابن النحاس فەرموویەتی: "چیرۆکی عمرو بن العاص لەگەڵ ئەم پیاوە هاوشێوەیە لەگەڵ چیرۆکی سلمة بن الأكوع لەگەڵ الأخرم الأسدي ﵄ ".

١١. بەیهەقی بە سەنەدی خۆی دەریهێناوە «لە سیار بن مالك فەرموویەتی: گوێم لە مالك بن دینار بوو فەرمووی: "کاتێك ڕۆژی الزاوية بوو عبد الله بن غالب فەرمووی: "من بیرم بۆ شتێك دەچێت کە ناتوانم ئارامی لەسەر بگرم، بمانبەن بۆ بەهەشت" فەرمووی: ئینجا کێلانی شمشێرەکەی شکاند و بەرەو پێش چوو جەنگا تاکو کوژرا، فەرمووی: لە گۆڕەکەیدا بۆنی میسك دەهات، مالیك فەرمووی: دەرچووم بەرەو گۆڕەکەی مشتە خۆڵێکم لێ هەڵگرت و بۆنم کرد، بۆنی میسکی لێ دەهات».

١٢. القرطبي لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووە: «کە سەربازی موسڵمانان کاتێك گەیشتن بە فارس، ئەسپی موسڵمانان لە بەرامبەر فیلەکان ڕایکرد کە ئەمە لە جەنگی پردەکە (الجسر) بوو، پیاوێك بە مەبەست فیلێکی لە قوڕ دروست کرد، ئەسپەکانیشی پێی هێور کردەوە تاکو ئاشنا بوون لەگەڵی، جا کاتێك بەیانی هات ئەسپەکان بەرامبەر فیلەکان ڕایان نەکرد، ئەویش هێرشی کردە سەر ئەو فیلەی کە لە پێشەوەی فیلەکانی ترەوە بوو، پێی وترا: ئەو دەتکوژێت، فەرمووی: "هیچ زەرەر و زیان نابێت گەر من بکوژرێم و موسڵمانان سەربکەون (فەتح بکەن)".

# بەشی چوارەم

## بەڵگەکانی قیاس

قیاس کردن بەسەر مەسەلەی قەڵغانی کردن بە موسڵمانان (التترس) : کۆمەڵێك لە ئەهلی عیلم و زانست دانیان بە جائیز بوونی کوشتنی ئەو موسڵمانانە داناوە کە دەکرێن بە قەڵغان ئەگەر هاتوو دوژمن وەك قەڵغان بەکاریان بهێنێت لەکاتی پێویستی و زەروورەت، ئەمەشیان بە جائیز زانیوە بە پشت بەستن بە بنچینەی (پێویستیەکان ڕێگە بە قەدەغەکراوەکان دەدەن) هەروەها بنچینەی (ئەنجامدانی مەفسەدە(خراپە) کەمەکە لەنێوان دوو خراپە)، ئەمەش لەو حاڵەتەی گەر دوژمن هاتە نێو خاکی موسڵمانان، یاخود ئەگەر هاتوو گورز وەشاندن نەیەتە دی تەنها بەوە نەبێت.

وێنەی قیاس:

قیاس لێرەدا دەبەسترێتەوە بە قیاسی هۆکار(قیاس العلة)، ئەمەش لەبەر ئەوەی هۆکاری لق(الفرع) بەهێزتر و ئاشکراترە لە هۆکاری بنچینە(علة الأصل)، ئەمەش وای لێدێت کە لق ئەولاترە لە بنچینە بۆ حوکم.

ئەرکانی قیاس:

١. ئەصل و بنچینەکە: کوشتنی نەفسی خەڵکی تر (ئەو موسڵمانانەی کە کراونەتە قەڵغان)، ئەگەر هاتوو دوژمن بیانکات بە قەڵغان لەکاتی پێویستی و زەروورەت.

٢. لق و فەرع: کوشتنی نەفس بە هۆکار یاخود بە ڕاستەوخۆ، بۆ داواکردنی شەهادەت یاخود وەشاندنی گورز لە دوژمن بۆ بەرژەوەندیەکی لاسەنگ و زاڵ.

٣. هۆکار (العلة): کوشتنی نەفسێکی موسڵمان بۆ بەرژەوەندیەکی شەرعی، جا لە مەسەلەی تەتەڕوس (قەڵغان کردن) جائیز کراوە کە نەفسی خەڵکی تر بکوژرێت سەرەڕای ئەوەی هیچ دەقێك نیە کە کوشتنی نەفسی تر ڕێگە پێ بدات بە هەر حاڵێك بێت، چونکە دەقەکان توندن بەرامبەر بەمە، لە مەسەلەی ئینغیماس ـیش چەندین دەق هاتووە کە هاندەدات لەسەر شەهید بوون و چوونە ناو هۆکارەکانی کوژران هەروەك لە پێشتر بەڵگەمان هێنایەوە و ڕوونمان کردەوە.

٤. حوکم: جا لەمەدا حوکمی ئینغیماس بە حەڵاڵ بوون ئەولاتر و فراوانترە لە حوکمی تەتەڕوس کە جائیز نیە تەنها بۆ پێویستی و زەروورەت نەبێت، کەواتە ئینغیماس حوکمی جائیز بوونی دەبێت لەگەڵ بەرژەوەندی بەهۆی ئەو دەقانەی هاتوون کە هاندەدەن لەسەر شەهید بوون.

**ئاگاداری:** قیاس لێرەدا بەرەو ڕووی وێنەی کردەوەکان دەکرێتەوە بە بۆمبڕێژکردن و تەفخیخ، چونکە ئەگەر ڕاستەوخۆ بەشداری لە کوشتنی نەفسی کەسانی تر لە موسڵمانان جائیز بێت، ئەوە ڕاستەوخۆ کوشتنی نەفسی خۆی ئەولاترە بە جائیز بوون و حەڵاڵیەتی، وە لەگەڵ بوونی ئەو دەقانەی کە داواکردنی شەهید بوونی تێدایە ئەوا لەم حاڵەتەدا ئەم ڕاستەوخۆییە دەبێتە خۆشویستراو و موستەحەب.

ابن النحاس لە مشارع الأشواق فەرموویەتی: «ئەگەر هاتوو کافران قەڵابەندی بکەن بە گیراوانی موسڵمانان و منداڵەکانیان (بیانکەن بە قەڵغان)، ئەگەر هیچ پێویستیەك بانگ نەکات بۆ ڕەم کردنیان(لێدانیان)، ئەوە وازیان لێ دەهێنین بۆ پاراستنی موسڵمانان، بەڵام ئەگەر هاتوو زەروور بێت و وا پێویست بکات بەوەی کە کافران بیانکەن بە قەڵغان لە حاڵەتی پێکدادان لە جەنگ، بە شێوەیەك گەر

هاتوو وازیان لێ بهێنین ئەوە کافران زەفەرمان پێ بەرن و زاڵ ببن بەسەرماندا، یاخود گورز وەشاندنیان زیاد بوو، یان نەتوانرا قەڵاکەیان بگیرێت، ئەوا ڕاستترین بۆچوون ئەوەیە کە جائیزە لێیان بدرێت، موسڵمانیش پارێزراو دەکرێت بەپێی توانا، ئەمە مەزهەبی شافعی و ئەحمەدە، ئەبو حەنیفەش بە جائیزی زانیوە کە لێیان بدرێت بە موتڵەقی -واتە بەبێ بوونی پێویستی و زەروورەت- بە مەنجەنیق و تیر و غەیری ئەمەش، بە مەرجی پاراستنی موسڵمان هەرچەندەی بتوانرێت، وە هەر لەسەر ئەمەش جێبەجێ دەکرێت ئەگەر هاتوو تەتەڕوس بکەن بە موسڵمانان (بیانکەن بە قەڵغان) لەناو ئامێرێك یان شتێکی تری وەك ئەمە والله أعلم».

# بەشی پێنجەم

## بەڵگەکان لە شەرعی گەلانی پێش خۆمان

لە چیرۆکی مێرمنداڵی لای جادووگەرەکە کە گیانی خۆی کردە قوربانی بۆ دین، تیایدا هاتووە: «ئینجا مێرمنداڵەکە هێنراو پێی وترا: پاشگەز ببەوە لە دینەکەت، بەڵام ڕەتی کردەوە، ئەویش دایە دەست چەند کەسانێك لە هاوەڵانی خۆی، گوتی: ببەن بیبۆ چیای فڵان و فڵان ئینجا سەریبخەنە سەر چیاکە، جا کە گەیشتنە لوتکەی چیاکە ئەگەر پاشگەز بوویەوە لە دینەکەی(ئەوە وازی لێ بێنن)، ئەگەرنا فڕێی بدەنە خوارەوە، ئەوانیش بردیان و سەریانخست بەسەر چیاکە، فەرمووی: "اللهم اکفنیهم بما شئت" واتە: ئەی پەروەردگارا ڕزگارم بکەیت لە دەستیان هەر چۆنێکت ویست، چیاکەش بەو کەسانەوە لەرزی و کەوتنە خوارەوە، ئینجا هاتەوە دەڕۆیشت بەرەو ڕووی پاشاکە، پاشاکە پێی وت: هاوەڵەکانت چیان کرد؟، فەرمووی: الله ڕزگاری کردم لە دەستیان، ئینجا دایەوە دەستی بەشێکی تر لە هاوەڵەکانی، گوتی: "ببەن و لەناو کەشتییەکی گەورە هەڵیبگرن و ببەنە ناوەندی دەریا، ئەگەر پاشگەز بوویەوە لە دینەکەی ئەگەرنا فڕێی بدەن"، ئەوانیش بردیان، فەرمووی: "اللهم اکفنیهم بما شئت" واتە: ئەی پەروەردگارا ڕزگارم بکەیت لە دەستیان هەر چۆنێکت ویست، کەشتییەکە ئاڕاستەی گۆڕا(کەوتە لەرزین)، هەموویان نوقم بوون، مێرمنداڵەکەش هاتەوە و بەرەو ڕووی پاشاکە دەڕۆیشت، پادشاکە پێی وت: "هاوەڵەکانت چیان کرد؟" فەرمووی: "الله ڕزگاری کردم لە دەستیان"، ئینجا بە پادشاکەی فەرموو: "تۆ ناتوانی بمکوژیت تا ئەوکاتەی ئەو شتە ئەنجام دەدەیت کە فەرمانت پێدەکەم"، گوتی: چیە ئەو شتە؟ فەرمووی: "خەڵکی لە دەشتاییەك کۆبکەیتەوە، منیش بە دارخورمایەکەوە لەخاچ بدەیت،

ئینجا تیرێك لە کیسی تیرەکانم بەرە، تیرەکە بخە ناو جەرگەی کەوانەکە، ئینجا بڵێ: "بسم الله رب الغلام" واتە: (بەناوی الله، پەروەردگاری مێرمنداڵەکە) وە ئینجا لێم بدە، چونکە تۆ ئەگەر ئەمەت کرد ئەوە دەمکوژیت" ئەویش خەڵکەکەی لە دەشتاییەك کۆکردەوە و بە دارخورمایەك لەخاچی دا (بەستایەوە)، ئینجا تیرێك لە کیسی تیرەکانی ئەوی برد، ئینجا تیرەکەی خستە ناو جەرگەی کەوانەکە، ئینجا گوتی: "بسم الله رب الغلام"، ئینجا تێی گرت و تیرەکە بەر لاتەنیشتێکی ڕووخساری کەوت، ئەویش دەستی دانایە سەر لاتەنیشتی ڕووخساری لە ناوچەی تیرەکە و مرد، خەڵکەکەش وتیان: "آمنا برب الغلام، آمنا برب الغلام، آمنا برب الغلام" واتە: "باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری مێرمنداڵەکە (سێ جار)"، ئینجا پادشاکە هات و پێی وترا: "ئایا دەزانی تۆ لە چ شتێك دەترسایت؟" سوێند بە الله ئەو ترسە توشت بوو بەڕاستی، خەڵکەکە باوەڕیان هێنا"، ئەویش فەرمانی کرد کە چاڵ هەڵ بکۆڵرێ لەسەر دەمی ئاسنە تیژەکان (کە زەویان پێ دەکێڵرێ، یاخود دەمی درەختەکانی خورما)، ئینجا چاڵەکان هەڵکۆڵران، وە ئاگر تیایدا هەڵگیرسێنرا، وە گوتی: "هەرکەسێ لە دینەکەی پاشگەز نەبوویەوە ئەوە بیکولێنن لەناویدا"، یاخود پێی بڵێن بڕۆ ناویەوە، ئەوانیش وایان کرد، تا ئەوکاتەی ئافرەتێك هێنرا کە منداڵێکی ساوای خۆی لەگەڵ بوو ئەویش خۆی پاراست لەوەی بکەوێتە ناویەوە، منداڵە بچووکەکەش پێی وت: ئەی دایکە ئارام بگرە چونکە تۆ لەسەر حەقی».

**ڕووی بەڵگە هێنانەوە:**

- لە چیرۆکەکە هاتووە کە مێرمنداڵەکە ڕێنمایی پادشاکەی کردووە لەسەر ڕێگای کوشتنی، یارمەتیدا لەسەر ئەو شتە و بووە هۆکار بۆ کوشتنی نەفسی خۆی،

ئەمەش لەپێناو بەرژەوەندیەكی لاسەنگ، كە بریتیە لە ئاشكرابوون و سەركەوتنی دین، شەرعیش مەدح و ستایشی كردەوەی مێرمنداڵەكەی كرد بەوەی كە باسی چیرۆكەكەی كردووە، وە لە قورئانیشدا لە ڕووی ستایش كردن و ئاگاداركردنەوە هاتووە، بەوەی كە ئەو كارەی هاوەڵانی چاڵەكان (أصحاب الأخدود) ئەنجامیاندا بریتیە لەو ڕێگەیەی كە گەیەنەرە بە بردنەوە و سەركەوتنی گەورە.

- وە تیایدا هاتووە كە ئەو ئافرەتەی خۆی دەپاراست لە چوونە ناوەوەی چاڵەكە، بەشداربوونی ڕاستەوخۆ بە دەست خۆی بوو، ئەگەرنا بۆچی خۆی دەپاراست و لادەچوو؟ الله تعالی ـش دڵی جێگیركرد بەوەی كە منداڵەكەی هێنایە گۆ، وە فەرمانی خۆڕاگری پێكرد، كە واتای ئەوەیە ڕاستەوخۆ بەشدار بێت لە نەفسی خۆیدا و خۆی بكات بەناو چاڵەكەدا، ئەگەرنا بۆچی فەرمانی خۆڕاگری پێ كرد لەوكاتەی كە خۆی دەپاراست؟!، جا ئەو تێگەیشتنەشی لێ وەردەگیرێت كە كشانەوە و خۆپاراستن لە خۆكردن بەناو چاڵەكە بەڵگە بوو لەسەر لاوازی و بێ هێزی، بە تایبەت بە بوونی منداڵێكی شیرەخۆر، الله تعالی ـش منداڵەكەی بەقسە هێنا وەك چەسپاندن و جێگیركردنێك بۆ ئافرەتەكە لەسەر چوونە نێو چاڵەكە، خۆ ئەگەر زۆر لێكراو بووایە بەوەی كە خەڵكی تر بەشدار بن لە فڕێدانی بۆ نێو چاڵەكە، ئەوە هیچ مانایەك بۆ ئەو وتەیە نەدەبوو: «خۆی دەپاراست لەوەی بچێتە ناویەوە»، لەمەشدا بە چیرۆكی ئافرەتەكە شاهێدێك وەدەست دێت لەسەر بەخشینی گیان لەپێناو الله هەروەها لەسەر شەرعی بوونی بەشداری ڕاستەوخۆ لە [كوشتنی] نەفس لەپێناو الله، چونكە شەرعیش ستایش و مەدحی چیرۆكی هاوەڵانی ئوخدود(چاڵەكان)ـی كردووە و پیای هەڵداوە.

٢. چیرۆكی ئەو ئافرەتەی كە سەری كچەكەی فیرعەونی شانە دەكرد:

- لە ئیبن عەباس ﵁ ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی: پەیامبەری الله ﷺ فەرموویەتی: «کاتێك ئەو شەوە بوو کە من ئیسڕائم پێکرا بۆنێکی خۆشم بۆ هات، وتم: ئەی جبریل ئەم بۆنە خۆشە چیە؟ فەرمووی ئەمە بۆنی شانەکاری کچەکەی فیرعەون و منداڵەکانی خۆیەتی، فەرمووی: وتم ئەی بابەتەکەی چیە؟ فەرمووی: ڕۆژێك لەڕۆژان کاتێك سەری کچەکەی فیرعەونی شانە دەکرد، شانەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە، وتی: بسم الله (بەناوی الله) کچەکەی فیرعەون پێی وت: باوکم؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو پەروەردگاری من و پەروەردگاری باوکیشت الله ـیە، وتی: هەواڵی پێ بدەم سەبارەت بەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش هەواڵی پێدا، بانگی کرد، وتی: ئەی فلانە، ئایا پەروەردگارێکی ترت هەیە جگە لە من؟ فەرمووی: بەڵێ، پەروەردگاری من و تۆش الله ـیە، ئەویش فەرمانی کرد بە هێنانی مانگایەکی مس و کوڵێنرا - واتە مەنجەڵێکی گەورە - ئینجا فەرمانی کرد کە خۆی و منداڵەکانی فڕێ بدرێنە ناویەوە، پێی وت: من لای تۆ پێویستیەکم هەیە، وتی: پێویستیەکەت چیە؟ فەرمووی: پێم خۆشە ئێسقانی من و منداڵەکەم کۆبکەیتەوە لە یەك کراس و بەو شێوەیەش ژێرخاکمان بکە، وتی: ئەمە حەقێکی تۆیە بەسەرمانەوە، فەرمووی: فەرمانی کرد منداڵەکانی فڕێ بدرێن، ئەوانیش یەك یەك فڕێ دەدران لەپێش خۆی، تاکو تەواو بوون گەیشت بە منداڵێکی شیرە خۆرە، وەك بڵێی ئەویش لەپێناو منداڵەکە خۆی دوور دەخستەوە و خۆی لادەدا، منداڵەکە وتی: ئەی دایکە، برۆ ناویەوە، چونکە عەزابی دونیا سوکترە لە عەزابی ئاخیرەت (قیامەت) ئەویش خۆی کرد بەناویدا..».

ڕووی بەڵگە هێنانەوە:

- لە فەرموودەکە هاتووە کە شانەکاری کچەکەی فیرعەون ڕاستەوخۆ بەشدار بوو لە کوشتنی نەفسی خۆی، ئینجا خۆی کرد بەناو مەنجەڵەکە، لەگەڵ ئەوەش شەرع مەدح و سەنای کردەوەکەی ئەو ئافرەتەی کردووە بە دوو ئاماژە: یەکەمیان لە سیاقی فەرموودەکە بە باسکردنی فەزڵ و چاکەی ئەم ئافرەتە، دووەمیان بەقسەهاتنی منداڵەکەی بە ئیزنی الله وە فەرمان کردن پێی بە خۆکردن بەناو مەنجەڵەکە کە ماناکانی خۆڕاگری لەخۆدەگرێت، هەروەها ئەوەی تیایە کە منداڵە شیرەخۆرەکە بووە هۆکاری خۆ فڕێدانە ناو مەنجەڵەکە و کوشتنی نەفسی خۆی، چونکە دایکەکە خۆی لادەدا لەپێناو ئەو، جا بەگۆ هاتنی منداڵەکە هیچ نەبوو تەنها بەڵگەیەك نەبێت لەسەر جێگیرکردن کە دەلالەت و ئاماژە دەدات بە ڕەزامەندی لەسەر کردەوەی خۆکردن بەناو مەنجەڵەکە و ستایش کردنی، چونکە چیرۆکەکە بەڵگەی دەقی تیایە لەسەر بەشداری ڕاستەوخۆی نەفس لە مردن.

## بەشێك

## لە باسکردنی وتەکانی ئەهلی عیلم و زانست دەربارەی مەسەلەی ئینغیماس

١. شافعی لە کتێبی الأم فەرموویەتی: «ئەگەر موسڵمانان هێرشیان کردە سەر وڵاتی جەنگ (بلاد الحرب یان بلاد الکفر)، جا سریەیەکی زۆر یان کەم بڕۆن بە مۆڵەتی پێشەوا (ئیمام)ـیان بەبێ مۆڵەت ئەوە وەکو یەکە و یەکسانە، بەڵام من لام خۆشویستراوە کە دەرنەچن تەنها بە مۆڵەتی پێشەوا نەبێت ئەمەش لەبەر چەند خەسڵەتێك: لەوانەش ئەوەیە کە ئیمام سود و قازانج دەگەیەنێت بە مەسەلەکە، هەروەها هەواڵ و ئاگاداری شتانێکی بۆ دێت کە خەڵکی ئاسایی نایزانن، هەرچەندەی هێز پێویست بێت دەیدات بە سریەکە، وە لایدەدات لەو شوێنانەی کە ترسی هەیە لەوێ لەناو بچێت، وە باشترین کۆکەرەوە بۆ کاروباری خەڵك ئەوەیە کە ئەمە بە فەرمانی پێشەوا بێت، ئەمەش دوورترە لە لەناوچوون، چونکە ئەوان لەوانەیە بەبێ مۆڵەتی پێشەوا ڕێبکەن و بڕۆن، وە کاروبارەکەشیان ڕێك نەبێت، لە ئەنجامدا تیابچن گەر بە تەنیا بن لە وڵاتی دوژمن، وە بڕۆن بەبێ ئەوەی بزانرێت، پێشەوا دەزانێت کە هێرشەکە لە ناوچەی ئەوانە کەچی یارمەتیان نادات، خۆ ئەگەر شوێنەکەی ئەوانیشی بزانیایە یارمەتی دەدان، ئەما سەبارەت بەوەی کە ئەو شتە حەڕام بێت لەسەریان، ئەوە نەمزانیوە حەڕام بێت، لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ باسی بەهەشتی کرد، پیاوێك لە پشتیوانان (الأنصار) پێی فەرموو: "ئەگەر هاتوو بە خۆڕاگری و حیسابکەری پاداشتەوە بکوژرێم"، فەرمووی: «بەهەشت بۆ تۆیە»، فەرمووی: جا ئینغیماسی کردە نێو کۆمەڵێك لە دوژمن ئەوانیش کوشتیان، هەروەها پیاوێکیش لە پشتیوانان ئەو قەڵغانەی فڕێدا

کە لەبەریدابوو کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەمەی باسکرد، خۆی کرد بەناو دوژمندا و ئەوانیش کوشتیان هەر لای پێغەمبەر ﷺ، هەروەها پیاوێکیش لە پشتیوانان دواکەوت لە هاوەڵەکانی خۆی لە بئر معونة، ئەویش بینی باڵندەکان دەسوڕێنەوە بە دەوری کوژرانی هاوەڵەکانی، بە عمرو بن أمیة ـی فەرمووو: "بەرەو ڕووی ئەو دوژمنانە دەڕۆم و ئەوانیش دەمکوژن و منیش دواناکەوم لە دیمەن و مەشهەدێك کە هاوەڵانمان تیایدا کوژراون"، ئەویش وایکرد و کوژرا، عمرو بن أمیة گەڕایەوە و ئەمەی باسکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرموودەیەکی چاکی لەبارەیەوە گوت، وە دەگوترێت، بە عەمروی فەرمووو: «ئایا تۆش بۆچی بەرەو پێش نەڕۆیشتی بۆ ئەوەی جەنگ بکەیت تاکو دەکوژرایت».

جا ئەگەر کرا بۆ پیاوی تەنها کە بەرەو ڕووی کۆمەڵێك پێشڕەوی بکات، ئەوە گومانی زاڵ لای ئەو و ئەوانەی کە دەیبینن ئەوەیە کە کۆمەڵەکە دەیکوژن لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش بە شێوەیەك دەیبینی کە ئەو خۆی ئەمان و سەلامەت بوونی خۆی بەو شێوەیە، ئەم حاڵەتەش زیاترە لەنێو تەنها بوونی پیاوێك یان چەند پیاوێك بەبێ مۆڵەتی پێشەوا».

٢. القرطبي فەرموویەتی: «زانایان ڕاجیاییان هەیە دەربارەی پیاوێك گەر خۆی بکات بەناو جەنگدا و بە تەنها بەرەو دوژمن بچێت، قاسم بن مخیمرة و قاسم بن محمد و عبد الملك لە زاناکانمان فەرموویانە: هیچ کێشەی تیانیە گەر هاتوو پیاوێك بە تەنها بدات بەسەر سوپایەکی زەبەلاح، ئەگەر هاتوو بەهێز بێت و بە نییەتێکی پاك بێت بۆ الله، بەڵام ئەگەر هاتوو هێزی نەبوو ئەوە دەبێتە خۆ لەناوبردن، وە گوتراوە ئەگەر داوای شەهادەت بکات و نییەتی پاك و خالص بێت

ئەوە با بدات بەسەریاندا، چونکە مەبەستەکەی یەکێکە لەوان، کە ئەمەش ڕوونە لە وتەی الله تعالی: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ}، هەروەها ابن خویز منداد فەرموویەتی: ئەما ئەگەر پیاو بدات بەسەر سەد کەس یان کۆمەڵێك سەرباز یاخود کۆمەڵێك دز و شەڕکەر و خەواریج، ئەوە ئەم شتە دوو حاڵەتی هەیە: ئەگەر زانی و زاڵ بوو بەسەر گومانیدا کە ئەوانە دەکوژێت کە هێرشی کردوونەتە سەر وە خۆی ڕزگاری دەبێت ئەوە شتێکی باشە، بە هەمان شێوە ئەگەر زانی و گومانی زاڵ بوو بەوەی کە دەکوژرێت، بەڵام گورز دەوەشێنێت یاخود کوشتارێکی باش دەکات یان کاریگەریەك بەجێ دەهێڵێت کە موسڵمانان سودی لێ ببینن، ئەوە بە هەمان شێوە جائیزە، هەروەها محمد بن الحسن فەرموویەتی: "ئەگەر یەك پیاو بدات بەسەر هەزار پیاو لە موشریکان و خۆیشی بە تەنها بێت، ئەوا ئەم شتە هیچی تیانیە، گەر هاتوو تەماحی لە ڕزگاربوون یاخود لە گورز وەشاندن لە دوژمن هەبێت، بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە نەبێت ئەوە مەکروهە، چونکە نەفسی خۆی توشی لەناوچوون کردووە بەبێ ئەوەی سودی بۆ موسڵمانان هەبێت، ئەگەر هاتوو مەبەستی ئەوە بێت موسڵمانان هان بدات تاکو وەکو ئەو بکەن، ئەوا جائیز بوونی دوور نیە وە لەبەر ئەوەی سودی تیایە بۆ موسڵمانان لە هەندێك ڕوو، وە ئەگەر مەبەستی ترساندنی دوژمن بێت وە بۆ ئەوەی دوژمن سەختی و توندی موسڵمانان ببینێت لە دین، ئەوە جائیز بوونی دوور نیە، وە ئەگەر سودی بۆ موسڵمانان تێدابێت لەئەنجامدا نەفسی خۆی لەناوبەرێت بۆ بەرزکردنەوە و بە عیززەت کردنی دینی الله، وە بێ هیواکردن و ساردکردنەوەی کوفر ئەوە بریتیە لەو پێگە شکۆمەندەی کە الله تعالی مەدحی ئیماندارانی پێکردووە کە فەرموویەتی: {إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَىٰ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ} تا

کۆتایی ئایەتەکە، بۆ غەیری ئەمەش لە ئایەتەکانی مەدح و ستایش کە الله تعالی مەدحی ئەوانەی کردووە کە نەفسی خۆیان دەکەنە قوربانی، وە پێویستە حوکمی فەرمان کردن بە چاکە و قەدەغەکردن لە خراپە هەر لەسەر ئەمە بێت، ئەوەیە کە هەرکاتێك داوای سود گەیاندنی کرد لە دین -دەچێت-نەفسی خۆی دەکاتە قوربانی تاکو دەکوژرێت، ئەوا لەنێو بەرزترین پلەی شەهیدەکانە"».

٣. ابن العربي لە تەفسیری أحکام القرآن لەناوچەی تەفسیری ئەم ئایەتە {وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ} فەرموویەتی: «دەربارەی لەناوچوونیش پێنج وتە هەن کە ئەمانەن: ١. واز مەهێنن لە بەخشین، ٢. بەبێ زاد و توێشوو دەرمەچن، ٣. واز لە جیهاد مەهێنن، ٤. مەڕۆنە نێو ئەو سەربازگانەی کە لەتوانای ئێوەدا نیە، ٥. هیوابڕاو مەبن لە لێخۆشبوون».

ئینجا فەرموویەتی: «الطبري دەفەرمووێت: ئەوە گشتییە لە هەموویاندا، هیچ پێچەوانەیی(تناقض)ـێکی تێدانیە، -ابن العربي- فەرمووی: پێکاویەتی تەنها لە مەسەلەی خۆکردن بەناو سەربازەکان نەبێت – واتە وتەی چوارەم – چونکە زانایان خیلاف و ڕاجیاییان هەیە لەمەدا».

ئینجا فەرموویەتی: «ڕاستیەکەش لای من ئەوەیە کە جائیزە ئەو کەسە خۆی بکات بەناو سەربازەکاندا گەر توانای ئەوانیشی نەبێت، چونکە چوار ڕووی تێدایە: یەکەم: داواکردنی شەهادەت، دووەم: بوونی گورز وەشاندن تیایدا، سێیەم: هاندانی موسڵمانان و گورج و گۆڵ کردنیان لە دژیان، چوارەم: لاوازی دەروونیان، بۆ ئەوەی ببینن ئەمە کردەوەی یەك کەسە ئەی چی دەربارەی کۆمەڵێك کەس».

٤. ابن عابدين له حاشیه‌که‌ی خۆیدا فه‌رموویه‌تی: «هیچی تیانیه گه‌ر پیاوێك به ته‌نها بدات به‌سه‌ریاندا ئه‌گه‌رچی گومانیشی وابێت كه ده‌كوژرێت، گه‌ر هاتوو شتێك بێنێته كایه‌وه به كوشتن یان بریندار كردن یاخود شكست بێنێت پێیان، چونكه ئه‌مه له كۆمه‌ڵێك له هاوه‌ڵان هاتووه (نه‌قڵ كراوه) له‌لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ له ڕۆژی ئوحود هه‌روه‌ها مه‌دح و ستایش كردنیشیان له‌سه‌ر ئه‌مه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر بزانێت گورز ناوه‌شێنێت لێیان، ئه‌وا حه‌ڵاڵ نیه بۆی كه بدات به‌سه‌ریاندا، چونكه به‌و به‌سه‌ردادانه‌ی هیچ شتێك له بڵندكردنه‌وه‌ی دین وه‌ده‌ست نایه‌ت».

٥. نه‌وه‌وی له شه‌رحی موسلیم فه‌رموویه‌تی: «بردنی گیان به‌ره‌و له‌ناوچوون له جیهاد جائیزه، هه‌روه‌ها له شه‌رحی موسلیم اتفاق و ڕێكه‌وتنی له‌سه‌ر نه‌قڵ كردووه، كه له باسكردنی جه‌نگی ذي قرد باسی كردووه».

هه‌روه‌ها له چیرۆكی عومه‌یری كوڕی حه‌مام (به‌ڵگه‌ی ژماره ١٤) له شه‌رحی موسلیم فه‌رموویه‌تی: «جائیز بوونی ئینغیماس بۆ ناو كافرانی تیایه هه‌روه‌ها چوون به‌ره‌و شه‌هاده‌ت(به‌ره‌و هۆكاره‌كانی) ئه‌مه‌ش جائیزه لای جمهور و زۆرینه‌ی زانایان و هیچ كه‌ڕاهه‌ت و ڕق لێبوونه‌وه‌یه‌كی تێدا نیه».

٦. ابن حزم له المحلى فه‌رموویه‌تی: « نه أبو أيوب الأنصاري و نه أبو موسى الأشعري ئینكاریان نه‌كرد له‌وه‌ی كه پیاو به ته‌نها بدات به‌سه‌ر سه‌ربازانێكی زۆر وه خۆڕاگر بێت تاكو ئه‌وكاته‌ی ده‌كوژرێت، فه‌رمووده‌یه‌كی موڕسه‌لیان باسكردووه له‌ڕێی حه‌سه‌ن كه موسڵمانان گه‌یشتن به موشریكان، پیاوێك فه‌رمووی ئه‌ی په‌یامبه‌ری الله: ئایا سه‌ختی بخه‌مه سه‌ریان یان بده‌م به‌سه‌ریاندا؟ پێغه‌مبه‌ر ﷺ پێی فه‌رموو: «ئایا وای ده‌بینی كه ئه‌مانه هه‌موویان بكوژیت؟ دانیشه

هەرکاتێك هاوەڵەکانت ڕاپەڕین ئەوە تۆش لەگەڵیان ڕاپەڕە، وە ئەگەر دایان بەسەریاندا ئەوە تۆش بدە بەسەریان»، کە ئەمەش موڕسەلە و هیچ بەڵگەو حوججەیەکی تێدا نیە، بەڵکو بە صەحیح هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە پیاوێك لە هاوەڵەکانی پرسیاری لێکرد: "ئایا چ شتێك دەبێتە هۆی پێکەنینی الله بۆ بەندەکەی" فەرمووی: «ئەگەر دەستی خۆی بخاتە نێو دوژمنەوە (بۆ جەنگان) بەبێ ئەوەی هیچ قەڵغانێکی لەبەر بێت»، پیاوەکەش قەڵغانەکەی بەر خۆی داکەند و فڕێی دا و خۆی کرد بەنێو دوژمنەوە تا ئەوکاتەی کوژرا رضي الله عنه».

٧. العز بن عبد السلام لە قواعد الأحكام فەرموویەتی: «پشت هەڵکردن و ڕاکردن لە ڕۆژی جەنگدا فەساد و خراپەیەکی گەورەیە، بەڵام واجبە ئەگەر هاتوو بزانێت دەکوژرێت بەبێ ئەوەی هیچ گورزێك بوەشێنێت لە کافران، چونکە بردنی گیان بەرەو لەناوچوون جائیزە لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی سەرخستنی دین و گورز وەشاندن لە موشریکانی تیایە، جا ئەگەر هیچ گورز وەشاندنێك وەدەست نەهات ئەوا کشانەوە واجب دەبێت چونکە لە خۆڕاگری و جێگیر بوون گیانەکان لە دەست دەچن و شیفای دڵی کافرانیشی تیایە، هەروەها سەرشۆڕکردنی ئەهلی ئیسلامیشی تیایە، ئەم جێگیر بوونەش دەبێتە مەفسەدە و خراپەیەکی تەواو کە هیچ بەرژەوەندی و مەسڵەحەتێك نیە لە ئەنجامدانی».

٨. ابن قدامة لە المغني فەرموویەتی: «ئەگەر هاتوو دوژمن لاوازی و بێ هێزی موسڵمانانی زیاد کرد، وە موسڵمانان بەسەر گومانیان زاڵ بوو کە کافران زەفەریان پێ دەبەن، ئەوا ئەولاترە جێگیر بن لەبەر ئەو بەرژەوەندیەی کە تیایدایە، وە ئەگەر بکشێنەوە جائیزە چونکە ئەوان دڵنیا نین لە زیان و لەناوچوون، حوکمیش

بەستراوەتەوە بە گومانەکە، لەکاتێکدا ئەوانیش کەمترن لە نیوەی دوژمنەکەیان، بۆیەش پێویستە لەسەریان جێگیر بن ئەگەر هاتوو لە نیوەی دوژمن زیاتر بن، ئەگەرچی بەسەر گومانیشیان زاڵ ببێت کە لەناوچوون و هەلاکەتی تێدابێت، وە ئەگەری ئەوەی هەیە کە جێگیر بوون پێویست بێت لەسەریان ئەگەر هاتوو بەسەر گومانیاندا زاڵ بوو کە زەفەریان پێ بەرن لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی و مەسڵەحەتی تیایە، وە ئەگەر زاڵ بوو بەسەر گومانیان کە لەناوچوون و هەلاکەت لە خۆڕاگری و جێگیر بوونیانە، وە نەجات و ڕزگار بوون لە کشانەوەیان بێت ئەوا ئەولاترە بۆیان کە بکشێنەوە، وە ئەگەر جێگیر ببن جائیزە چونکە ئەوان ویست و حەزی شەهادەتیان هەیە، جائیزە ئەگەرچی شکستیش بخۆن بە هەمان شێوە، وە ئەگەر بەسەر گومانیاندا زاڵ بوو کە لەناوچوون لە کشانەوە و جێگیر بووندایە، ئەوە ئەولاترە جێگیر ببن بۆ ئەوەی پلەی شەهیدە پێشڕەوەکان لە جەنگ کە حیسابی پاداشتیان کردبێت بەدەست بهێنن، لەمەشدا باشتر دەبن لەوانەی پشتیان هەڵکردووە، چونکە بە هەمان شێوە جائیزە گەر شکستیش بهێنن».

٩. ابن النحاس لە مشارع الأشواق فەرموویەتی: «لەم فەرموودە جێگیرەشدا (واتە فەرموودەی ژمارە ٩) ڕوونترین بەڵگە هەیە لەسەر جائیز بوونی بەسەردادانی یەك کەس بۆ سەر کۆمەڵێکی زۆر لە دوژمن بە تەنها، ئەگەرچی بەسەر گومانیشیدا زاڵ بێت کە دەکوژرێت، بە هەمان شێوە گەر هاتوو نیەتپاك و مخلص بێت لە داواکردنی شەهادەت، هەروەك چۆن الأخرم الأسدي وایکرد ﵁، پێغەمبەریش ﷺ ئینکاری کردەوەکەی لێ نەکرد و عەیبداری نەکرد، هاوەڵانیش نەهی و قەدەغەیان نەکردووە لە کردەوەی هاوشێوە، بەڵکو لە فەرموودەکەدا بەڵگە هەیە لەسەر خۆشویستران و استحبابی ئەم کارە و فەزڵ و چاکییەکەی،

چونکە پێغەمبەر ﷺ مەدحی أبا قەتادە و سەلەمەی کرد لەسەر کردەوەکانیان هەروەك لەپێشتر باسمان کرد، سەرەڕای ئەوەی هەردووکیان بە تەنها دایان بەسەر دوژمن، وە چاوەڕێشیان نەکرد تاکو موسڵمانان پێیان بگەن».

١٠. شیخ الاسلام ابن تیمیة رحمه الله تعالی لە مجموع الفتاوی فەرموویەتی: «موسلیم لە صەحیحەکەیدا چیرۆکی هاوەڵانی ئوخدودی ڕیوایەت کردووە وە تیایدا هاتووە: (کە مێرمنداڵەکە فەرمانی کرد بە کوشتنی نەفسی خۆی لەپێناو بەرژەوەندی دەرکەوتن و سەرکەوتنی دین)، لەبەر ئەمەش چوار پێشەواکە بە جائیزیان زانیوە کە موسڵمان خۆی بکات بەناو ڕیزی کافران، ئەگەرچی گومانیشی زاڵ بێت بەوەی کە دەیکوژن، ئەگەر هاتوو لەمەدا بەرژەوەندی و مەسڵەحەتێکی موسڵمانانی تێدابێت، ئێمەش وتەمان لەسەر ئەو بابەتە درێژکردۆتەوە لە شوێنێکی تر، جا ئەگەر پیاو ئەو شتە بکات کە بڕوای وابێت دەکوژرێت لەپێناو بەرژەوەندی جیهاد، سەرەڕای ئەوەی کوشتنی نەفسی خۆی گەورەترە لەکوشتنی غەیری خۆی: ئەوا ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی کوشتنی غەیری خۆی لەپێناو بەرژەوەندی دین کە بەدەست نایەت تەنها بەو شتە نەبێت، هەروەها بەرپەرچ دانەوەی زیانی دوژمنی خراپەکار و موفسید لەدین و دونیا کە بەرپەرچ نادرێتەوە و تێك ناشکێنرێت تەنها بەو شتە نەبێت-ئەوا جائیزە-».

هەروەها شیخ الاسلام رحمه الله لە الفتاوی فەرموویەتی: «ئەما وتەکەی: دەمەوێت نەفسی خۆم بکوژم لەپێناو الله، ئەمە وتەیەکی گشتگیرە چونکە ئەو ئەگەر هاتوو ئەوە ئەنجام بدات کە الله تعالی فەرمانی پێکردووە، لەئەنجامدا ئەو شتە ببێتە هۆی کوشتنی نەفسی خۆی ئەوە شتێکی چاکی کردووە، وەك ئەو کەسەی کە بە

